


کۆمەڵی دادگەریی کوردستان/عێراق
ئەنجومەنی بانگەواز و پەروەردە

پرۆژەی
قورئان بەهاری دڵانە





# دوعاکانی قورئان

١

١٤٤٤ك _ ٢٠٢٢ز

کۆمەڵی دادگەری کوردستان/عێراق

ئەنجومەنی بانگەواز و پەروەردە



پرۆژەی

# بەهاری دڵان



## دوعاکانی قورئان



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾

(غافر: ٦٠)

(الدعاء هو العبادة)

رواه: أبوداود والترمذي وابن ماجه



# پرۆژەی بەهاری دڵان

## دوعاکانی قورئان

ئامادکردنی: ئەنجومەنی بانگەواز و پەروەردە

نەخشەسازی: ڕەوشت محەمەد

ساڵی چاپ: ١٤٤٤ك - ٢٠٢٢ز

چاپ: یەکەم

# ناوەرۆك

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

قورئان کۆتا پەیامی خوای گەورەیە داییەزاندووە بۆ هیدایەت و ڕێنموونی مرۆڤەکان، وە بە کۆتا پێغەمبەردا ناردویەتی کە خاتەمی پێغەمبەرانە (صەلات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێت). کەواتە قورئان پەیامێکی گەورەو گرنگی خوایە بۆ مرۆڤایەتی تا ڕۆژی دوایی، لەبەرئەوە دەبێت لە هەموو ڕوویەکەوە گرنگی پێبدرێت.

لەم سۆنگەیەوە (ئەنجومەنی بانگەوازو پەروەردە)ی کۆمەڵی دادگەریی، هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی پرۆژەی (بەهاری دلان)، وە یەکەم پێشبڕکێش (دوعاکانی قورئان) دەبێت، بۆ زیاتر گرنگیدان بە قورئان و سەرقاڵبوون پێیەوە، بە خوێندنەوەی و زانینی ماناو تەفسیرەکەی و بەسەربردنی کاتێکی باش لەخزمەتیدا لەزۆر ڕووەوە،بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە لە پرۆژەی پێشبڕکێکەدا.

وە سەرجەم موسوڵمانان لە هەر تەمەنێکدا بن لە (هەردوو ڕەگەز)، دەتوانن بەشداربن لەو پێشبڕکێیەدا، وە (سەد) کەس لەوانەی نمرەی بەرز بە دەست دەهێنن خەڵات دەکرێن.

1

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)﴾

**(الفاتحة: ١ - ٧)**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، بەخشندەی میهرەبانە (تەنها ئەوە) خاوەنی ڕۆژی سزا و پاداشت دانەوە (خوایە) تەنها تۆ دەپەرستین، وە تەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین، ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاستی ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون(لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و چاکەکاران)، نەک (ڕێگای) ئەوانەی خەشمی (تۆ)یان لێگیراوە (وەک جولەکە و هاوکردەوەکانیان) وە نەک (ڕێگای) گومڕایان وەک (گاورەکان و هاوکردەوەکانیان).

# مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| الْحَمْدُ لِلَّهِ | هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ خوا |
| رَبِّ الْعَالَمِينَ | پەروەردگاری جیهانیان |
| الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ | بەخشندەی میهرەبان |
| مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ | خاوەنی ڕۆژی سزا و پاداشت دانەوە |
| إِيَّاكَ نَعْبُدُ | (خوایە) تەنها تۆ دەپەرستین |
| وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ | وە تەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین |
| اهْدِنَا | ڕێنموونیمان بکە |
| الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ | بۆ ڕێگای ڕاستی |
| صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ | ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون |
| غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ | نەک (ڕێگای) ئەوانەی خەشمی (تۆ) یان لێگیراوە |
| وَلَا الضَّالِّينَ | وە نەک (ڕێگای) گومڕایان |

# باسی فەزڵ و گەورەیی سورەتی فاتیحە

عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي, فَدَعَانِي النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - فَلَمْ أُجِبْهُ, قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي. قَالَ: ((أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ:(اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ) **الأنفال: ٢٤**)) ثُمَّ قَالَ: ((أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟)). فَأَخَذَ بِيَدِي، فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْرُجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ قُلْتَ: ((لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ)). قَالَ: ((الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ)). رواه البخاري

واتە: ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: من (لەمزگەوتدا) نوێژم دەکرد، جا پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردم منیش وەڵامم نەدایەوە، ووتم: ئەی پیغەمبەری خوا من نوێژم دەکرد (بۆیە وەڵامم نەدایتەوە) پیغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ((ئایا خوا نەیفەرمووە: وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە کاتێ بانگی کردن)) لەپاشان فەرمووی پێم: ((ئایا پێش ئەوەی لە مزگەوت بڕۆیتە دەرەوە فێری گەورەترین سورەتت بکەم لە قورئاندا؟)) ئینجا دەستی گرتم، جا کە ویستمان لە مزگەوت بڕۆینە دەرەوە عەرزم کرد: ئەی پیغەمبەری خوا تۆ فەرمووت: ((بێگومان گەورەترین سورەتی قورئانت فێر دەکەم)) فەرمووی: (سورەتی) (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)ە، ئەو سورەتە حەوت ئایەتی دوبارە بووەوەیە وە ئەو قورئانی گەورەیە کە بەمن دراوە)).

٢

## دوعای ئادەم و حەوا (علیهما السلام):

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ **(الأعراف: ٢٣)**

هەردووکیان وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد جا ئەگەر لێمان نەبوری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە ئێمە لە زیانباران دەبین.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا | ئەی پەروەردگارمان |
| ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا | ستەممان لە خۆمان کرد |
| وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا | جا ئەگەر لێمان نەبوری |
| وَتَرْحَمْنَا | وە ڕەحممان پێ نەکەیت |
| لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ | سوێند بەخوا بەدڵنیاییەوە ئێمە لە زیانباران دەبین |

٣

## دوعای ئەوانەی لە ئەعرافدان:

﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٤٧)﴾ الأعراف: ٤٧

ئەی پەروەردگارمان مەمانخەرە ڕیزی گەلی ستەمکارانەوە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| لَا تَجْعَلْنَا | مەمانخەرە |
| مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ | ڕیزی گەلی ستەمکارانەوە |

٤

## دوعای شوعەیب پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾

الأعراف: ٨٩

ئەی پەروەردگارمان لە نێوان ئێمە و گەلەکەماندا حوکم و بڕیار بدە بەهەق تۆ باشترینی بڕیار دەرانی.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| افْتَحْ | حوکم و بڕیار بده |
| بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا | له نێوان ئێمه و گەلەکەماندا |
| بِالْحَقِّ | بەهەق و ڕاستی |
| وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ | وه تۆ باشترینی بڕیاردەرانی |

٥

## دوعاى ئەو ساحيرانەى باوەڕيان هێنابە مووسا (عليه السلام):

﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ (١٢٦)﴾ الأعراف: ١٢٦

ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان بەسەردا بڕێژه و به مسوڵمانیەتی بمانمرێنه.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| أَفْرِغْ عَلَيْنَا | بڕێژه بەسەرماندا |
| صَبْرًا | ئارامی وخۆڕاگری |
| وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ | وه به مسوڵمانیەتی بمانمرێنه |

٦

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾

(الأعراف: ١٥١)

ئەی پەروەردگارم لە خۆم و براکەم خۆش بە وە بمانخەرە ناو بەزەیی و میهرەبانی خۆتەوە تۆ میهرەبانترینی هەموو میهرەبانانیت.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِأَخِي | ئەی پەروەردگارم لە خۆم و براکەم خۆش بە |
| وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ | وە بمانخەرە ناو بەزەیی و میهرەبانی خۆتەوە |
| وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ | وە تـــۆ میهرەبـــانترینی هەموو میهرەبانانیت |

٧

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ (١٥٥) وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ (١٥٦)﴾ (الأعراف: ١٥٥- ١٥٦)

کەواتە لێمان خۆش ببەو ڕەحمان پێ بکە چونکە باشترین لێبوردە هەر تۆی (خوایە) لەم دنیادا چاکەمان بۆ بنووسە هەروەها لەڕۆژی دوایشدا بەڕاستی ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە (پەروەردگار) فەرمووی: سزاو ئازارم دووچاری هەر کەسێک دەکەم کە بمەوێ وە بەزەیی و ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا | کەواتە لێمان خۆش ببەو ڕەحممان پێ بکە |
| وَأَنْتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ | چونکە باشترین لێبوردە هەر تۆی (خوایە) |
| إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ | بەڕاستی ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە |
| عَذَابِي | سزاو ئازارم |
| أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ | دووچاری هەر کەسێک دەکەم کە بمەوێ |
| وَرَحْمَتِي | وە بەزەیی و ڕەحمەتم |
| وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ | هەموو شتێکی گرتۆتەوە |

٨

## دوعای گەلی مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٨٥) وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٨٦)﴾ (یونس: ٨٥- ٨٦)

ئەی پەروەردگارمان مەمانگێڕە بە جێگەی ئەشکەنجەو ئازار بۆ گەلی ستەمکاران. وە ڕزگارمان بکە بە بەزەیی خۆت لەدەست کۆمەڵی بێ بڕوایان.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً | مەمانکە بەهۆی تاقیکردنەوە |
| لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ | بۆ گەلی ستەمکاران |
| وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ | وە ڕزگارمان بکە بە بەزەیی خۆت |
| مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ | لەدەست کۆمەڵی بێ بڕوایان |

٩

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ (٨٨)﴾ یونس: ٨٨

ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ بەخشیووتە بە فیرعەون و کۆمەڵەکەی هۆکاری ڕازانەوە و جوانی و ماڵ و سامانی زۆر لە ژیانی دنیادا ئەی پەروەردگارمان بۆ ئەوەی خەڵک گومڕا بکەن لە ڕێگای تۆ ئەی پەروەردگارمان ماڵ و سامانیان لە ناوی بەرە و مەیهێڵە وەدڵەکانیان ڕەق و ڕەش بکە چونکە بڕوا ناهێنن هەتا (بەچاوی خۆیان) نەبینن سزای سەختی ئازاردەر.( ئەم دوعایەش پەیوەندی بەو کات ساتەو کەسانەوە هەیە).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| آتَيْتَ | بەخشیووتە |
| فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ | بە فیرعەون و پیاو ماقوڵەکانی |
| زِينَةً وَأَمْوَالًا | هۆکاری ڕازانەوە و جوانی و ماڵ و سامانی زۆر |
| لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ | بۆ ئەوەی خەڵک گومڕا بکەن لە ڕێگاو ڕێبازی تۆ |
| اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ | ماڵ و سامانیان لە ناوی بەرە و مەیهێڵە |
| وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ | وەدڵەکانیان ڕەق و ڕەش بکە |

١٠

## دوعای نوح پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي
وَتَرْحَمْنِي أَكُنْ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٤٧)﴾ **هود: ٤٧**

پەروەردگارم بەڕاستی من پەنات پێ دەگرم (لەوەی) داوای شتێکت لێ بکەم کە نایزانم وە ئەگەر نەبوریت لێم و ڕەحمم پێ نەکەی لە زیان لێکەوتوان دەبم.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| إِنِّي أَعُوذُ بِكَ | بەڕاستی من پەنات پێ دەگرم |
| أَنْ أَسْأَلَكَ | (لەوەی) داوای شتێکت لێ بکەم |
| مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ | کە هیچ زانیارییەکم دەربارەی نیە |
| وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي | ئەگەر نەبوریت لێم و ڕەحمم پێ نەکەی |
| الْخَاسِرِينَ | زیان لێکەوتوان |

١١

## دوعای یوسف پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (١٠١)﴾ یوسف: ١٠١

ئەی پەروەردگارم بەڕاستی پێت بەخشیووم هەندێک لە دەسەڵات و پاشایەتی وە هەندێکیش لە لێکدانەوەی خەوت فێرکردوم ئەی دروست کاری ئاسمانەکان و زەوی تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دوایی دا بە موسوڵمانێتی بمرێنە و (لەدوا ڕۆژ دا) بمخەرە ریزی پیاو چاکانەوە. (بەشی یەکەمی ئەم دوعایە تایبەتە بە یوسف پێغەمبەرەوە (علیه السلام).

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| قَدْ آتَيْتَنِي | بەڕاستی پێت بەخشیووم |
| الْمُلْكِ | دەسەڵات وپاشایەتی |
| وَعَلَّمْتَنِي | وە فێرتکردووم |
| مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ | هەندێک لە لێکدانەوەی خەو |
| فَاطِرَ | بەدیهێنەری، دروستکاری |
| أَنْتَ وَلِيِّي | تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی |
| تَوَفَّنِي مُسْلِمًا | بە موسوڵمانێتی بمرێنە |
| وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ | وە (لەدوا ڕۆژدا ) بمخەرە ڕیزی |

۱۳

## دوعاى ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ
(۳۵) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي
وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (۳۶) رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ
ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ

فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ
يَشْكُرُونَ (٣٧) رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى
اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ (٣٨) الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي
وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ
(٣٩) رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ
(٤٠) رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ (٤١)﴾

**إبراهيم: ٣٥ - ٤١**

ئەی پەروەردگارم ئەم شارە (مەککە) بکە بە شارێکی ئارام و ئاسایش وە خۆم و کوڕەکانم بپارێزە و دوورخەرەوە لەوەی بتەکان بپەرستین. ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە زۆر لە خەڵکیان گومڕا کردووە (و لایان دان لەڕێگەی ڕاست) جا هەر کەسێ (لە ڕۆڵەکانم) شوێن من کەوت ئەوە بێگومان لە منە هەرکەسیش سەرپێچی کردم ئەوە بێگومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی. ئەی پەروەردگارمان من هەندێ لە ڕۆڵەکانم نیشتەجێ کرد لە شیوێکی بێ کشتوکاڵ دا لای ماڵە پیرۆز و ڕێزگیراوەکەت ئەی پەروەردگارمان تا بە چاکی نوێژ بەجێ بێنن بەڵکو دڵی خەڵکانێ وا لێبکەیت سۆزیان ببێ بۆ لایان و لە هەموو بەر و میوەیەکیش ڕۆزیان بدە بەڵکو شوکرانە بژێرن. ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرچی دەشارینەوە و هەرچی ئاشکرا دەکەین تۆ دەیزانیت وە هیچ شتێ لای خوا شاراوە نی

یە نە لەزەوی و نە لەئاسماندا. هەموو سوپاس و ستایشێک بۆ ئەو خوایەی کە ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم بەپیری بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە. ئەی پەروەردگارم من و ڕۆڵەکانم وا لێبکەی بە چاکی نوێژەکان بەجێ بێنین ئەی پەروەردگارمان پاڕانەوە و نزاکەم وەرگرە. ئەی پەروەردگارمان لە من و باوکم و دایکم و هەموو بڕواداران ببورە و خۆش ببە لە ڕۆژێک دا کە لێپرسینەوە دەکرێ و بەرپا ئەبێ.( ئەم دوعایەش باسەکانیتایبەتن بە ئیبراهیم پێغەمبەرەوە (علیه السلام).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| آمِنًا | ئارام و ئاسایش |
| وَاجْنُبْنِي | وە بمبپارێزە |
| الْأَصْنَامَ | بت وپەرستراوەکان |
| أَضْلَلْنَ | گومڕایان کردووە |
| تَبِعَنِي | شوێن من کەوت |
| عَصَانِي | سەرپێچی کردم |

| | |
|---|---|
| أَسْكَنْتُ | نیشتەجێم کرد |
| بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ | لە شیوێکی بێ کشتوکاڵ دا |
| بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ | لای ماڵە پیرۆز و ڕێزگیراوەکەت دا |
| لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ | تا بە چاکی نوێژ بەجێ بێنن |
| أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ | دڵی خەڵکانێک |
| تَهْوِي إِلَيْهِمْ | سۆزیان ببێ بۆ لایان |
| الثَّمَرَاتِ | بەروبوم و میوەجات |
| مَا نُخْفِي | ئەوەی دەیشارینەوە |
| وَمَا نُعْلِنُ | وە ئەوەی ئاشکرادەکەین |
| وَهَبَ لِي | پێی بەخشیم |
| عَلَى الْكِبَرِ | بەپیری |
| لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ | بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە |
| اجْعَلْنِي | بمگێڕە، بمکەرە |
| مُقِيمَ الصَّلَاةِ | بە بەجێهێنەری نوێژەکان بەچاکی |
| ذُرِّيَّتِي | ڕۆڵەکانم |

١٣

# دوعای باوەڕداران لە ئوممەتی ئیسلام:

﴿رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا (٢٤)﴾ **الإسراء: ٢٤**

ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردە کرد بە منداڵی.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبِّ ارْحَمْهُمَا | ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە (بەدایک وباوکم) |
| رَبَّيَانِي | هەردوکیان (دایک وباوکم) پەروەردەیان کردم |
| صَغِيرًا | بە منداڵی، کاتێ منداڵ بووم |

۱٤

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم:

﴿وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا (٨٠)﴾ الإسراء: ٨٠

وە بڵێ ئەی پەروەردگارم (لەهەر کارێکدا بووم) ڕاست و چاک پێم ئەنجام بدە ڕاست و چاکیش پێم کۆتایی بێنە وە لەلایەن خۆتەوە بۆم بسازێنە دەسەڵاتێکی یارمەتی دەر (کە زاڵ بم بەسەر هەموو کۆسپێکدا).

قَالَ ابن عباس رضي الله عنهما: كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم بِمَكَّةَ فأُمِرَ بِالْهِجْرَةِ وأُنزِلَ عَلَيْهِ: ( وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا ) الإسراء: ٨٠
رواه أحمد والترمذي والحاكم

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر لە مەککە بووئینجا فەرمانی پێکرا بە کۆچکردن (بۆ مەدینە) وە ئەم ئایەتەی بۆ دابەزێنرا: (وە بڵێ ئەی پەروەردگارم (لەهەر کارێکدا بووم) ڕاست و چاک پێم ئەنجام بدە ڕاست و چاکیش پێم کۆتایی بێنە وە لەلایەن خۆتەوە بۆم بسازێنە دەسەڵاتێکی یارمەتی دەر (کە زاڵ بم بەسەر هەموو کۆسپێکدا).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ | (لەهەر کارێکدا بووم) ڕاست و چاک پێم ئەنجام بدە |
| وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ | ڕاست و چاکیش کۆتایی بێنە پێم |
| سُلْطَانًا نَصِيرًا | دەسەڵاتێکی یارمەتی دەر (کە زاڵ بم بەسەر هەموو کۆسپێکدا) |

**١٥**

## دوعای هاوەڵانی ئەشکەوت:

﴿رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ الكهف: ١٠

ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەتێکمان پێ ببەخشە وە ڕێی ڕاست و ڕزگاریمان بۆ فەراهەم بێنە لەم ئیش وکارەماندا.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا | ئەی پەروەردگارمان |
| آتِنَا | پێمان ببەخشە |
| مِنْ لَدُنْكَ | لەلایەن خۆتەوە |
| وَهَيِّئْ لَنَا | وە فەراهەم بێنە بۆمان |
| مِنْ أَمْرِنَا | لەم ئیش وكارەماندا |
| رَشَدًا | ڕێی ڕاست و ڕزگاری |

١٦

## دوعای زەكەریيا پێغەمبەر (عليه السلام):

﴿فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا (٥)﴾ مريم: ٥

سا تۆ لەلایەن خۆتەوە منالێكی چاكم پێ ببەخشە.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| وَلِيًّا | جێگر وجێنشینێک، منداڵێک |

١٧

## دوعای مەریەم (علیها السلام):

﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا﴾ مريم: ١٨

(مەریەم) وتی من پەنا دەگرم بەخوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر تۆ لە خوا ترسیت (وازم لێ بێنە و زیانم پێ مەگەیەنە).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| أَعُوذُ | پەنا دەگرم |
| بِالرَّحْمَنِ | بەخوای میهرەبان |
| إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا | ئەگەر تۆ لە خوا ترسیت |

١٨

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي (٢٥) وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي (٢٦) وَاحْلُلْ
عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي (٢٧) يَفْقَهُوا قَوْلِي (٢٨) وَاجْعَلْ لِي وَزِيرًا مِنْ
أَهْلِي (٢٩) هَارُونَ أَخِي (٣٠) اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي (٣١) وَأَشْرِكْهُ فِي

أَمْرِي (٣٢) كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (٣٣) وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا (٣٤) إِنَّكَ كُنْتَ بِنَا بَصِيرًا (٣٥)﴾ طه: ٢٥ - ٣٥

پەروەردگارم سنگم (دڵ و دەروونم) فراوان بکە، و ئیش و کارم بۆ ئاسان بکە، و گرێی زمانیشم بەرەڵا بکە، بۆ ئەوەی لە قسەکانم تێ بگەن، وە لە خزم و کەسی خۆم کەسێک بکەرە پشتیوانم، کە هاروونی برامە، پشتمی پێ قایم و بەهێز بکە، بیکەرە هاوبەشم لە کارەکەمدا -گەیاندنی پەیامی خوایە-، بۆ ئەوەی زۆر ستایشت بکەین، وە یاد و زیکری زۆرت بکەین، بەڕاستی تۆ بینای بە (هەموو شتێکی) ئێمە. (هەندێکی ئەم دوعایە تایبەتە بە پێغەمبەر مووساوە (علیه السلام).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| اشْرَحْ لِي صَدْرِي | سنگم (دڵ و دەروونم) فراوان بکە |
| وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي | وە ئیش و کارم بۆ ئاسان بکە |
| وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي | وە گرێی زمانم بەرەڵا بکە |
| وَزِيرًا | پشتیوانێک |
| اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي | پشتمی پێ قایم و بەهێز بکە |
| بَصِيرًا | بیناو ئاگاداری |

**١٩**

## دوعای ئەیوب پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (٨٣)﴾ الأنبياء: ٨٣

بەڕاستی من زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە و تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| مَسَّنِيَ الضُّرُّ | زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە |

**٢٠**

## دوعای زەکەریبا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ (٨٩)﴾ الأنبياء: ٨٩

ئەی پەروەردگارم بەتەنها مەمهێڵەرەوە (منداڵێکم پێ ببەخشە) وە تۆ چاکترین میراتگرانی.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| لَا تَذَرْنِي فَرْدًا | بەتەنها مەمهێڵەرەوە (منداڵێکم پێ ببەخشە) |
| وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ | وە تۆ چاکترین میراتگرانی |

**٢١**

## دوعای نوح پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ أَنْزِلْنِي مُنْزَلًا مُبَارَكًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ﴾ **المؤمنون: ٢٩**

ئەی پەروەردگارم دامبەزێنە (لە کەشتیەکە) لە جێگایەکی پیرۆز و بەفەڕدا (کە کێوی جوودی یە لە کوردستانی تورکیا) وە تۆ (خوایە) چاکترینی دابەزێنەرانی.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| أَنْزِلْنِي | دامبەزێنە (لە کەشتیەکە) |
| مُنْزَلًا | لە جێگایەکی |
| مُبَارَكًا | پیرۆز و بەفەڕدا (کە کێوی جوودی یە لە کوردستانی تورکیا) |
| وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ | وە تۆ (خوایە) چاکترینی دابەزێنەرانی |

٢٢

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم:

﴿رَبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ (٩٣) رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٩٤)﴾

**المؤمنون: ٩٣ - ٩٤**

ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو سزایەی کە بەڵێن دراوە بەوان هەر نیشانم دەدەیت. ئەی پەروەردگارم مەمخەرە ڕیزی گەلی ستەمکارانەوە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| إِمَّا تُرِيَنِّي | ئەگەر هەر نیشانم دەدەیت |
| مَا يُوعَدُونَ | ئەو سزایەی کە بەڵێن دراوە بەوان |
| فَلَا تَجْعَلْنِي | کەواتە مەمخەرە |

٢٣

# دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم:

﴿رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ (٩٧) وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ (٩٨)﴾ المؤمنون: ٩٧ - ٩٨

ئەی پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە خەتەرە (و پاڵنەر) و وەسوەسەی شەیتانەکان، وە پەنات پێ دەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن لام (سەرم لێ بشێوێنن).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ | لە خەتەرە (و پاڵنەر) و وەسوەسەی شەیتانەکان |
| أَنْ يَحْضُرُونِ | لەوەی (شەیتانەکان) ئامادەبن لام (سەرم لێ بشێوێنن) |

٢٤

## دوعای کافران:

﴿رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ (١٠٦) رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ (١٠٧)﴾ المؤمنون: ١٠٦ - ١٠٧

ئەی پەروەردگاری ئێمە بەدی و خراپی خۆمان زاڵ بوو بوو بەسەرماندا وە ئێمە کەسانێکی گومڕابووین، ئەی پەروەردگارمان لەم (دۆزەخە) دەرمان بێنە جا ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ بێ باوەڕی) ئەوە بەڕاستی ئێمە ستەمکارین. (دەبێ مسوڵمان خۆی بپارێزێ کردەوەکانی لە دنیادا وا نەبێت لە قیامەتدا ئەو دوعایە بکات کە دوعای کافرو بێباوەڕانە)

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| غَلَبَتْ عَلَيْنَا | زاڵ بووە بەسەرماندا |
| شِقْوَتُنَا | بەدبەختی نەگبەتی خۆمان |
| ضَالِّينَ | گومڕایان |
| أَخْرِجْنَا مِنْهَا | لەم (دۆزەخە) دەرمان بێنە |

٢٥

## دوعای کۆمەڵێ لە باوەڕداران:

﴿رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ المؤمنون: ١٠٩

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە دەی لێیان خۆش بە و ڕەحممان پێ بکە چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانی.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا آمَنَّا | ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە |
| وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ | وە تۆ چاکترینی میهرەبانانی |

٢٦

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم:

﴿رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ المؤمنون: ١١٨

ئەی پەروەردگارم لێم خۆش بە و ڕەحمم پێ بکە وە تۆ (خوایە) چاکترینی میهرەبانانی.

## ٢٧

## دوعای (عباد الرحمان) بەندەیانی خوای میهرەبان:

﴿رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾

**الفرقان: ٦٥**

ئەی پەروەردگارمان سزای دۆزەخمان لێ لادە بەڕاستی سزای ئەو (دۆزەخە) لانەچووی بەردەوامە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| اصْرِفْ عَنَّا | لایدە لێمان، دووری خەرەوە لێمان |
| غَرَامًا | لانەچووی بەردەوامە |

## ٢٨

## دوعای ئەو باوەڕدارانەی یادی خودا دەکەن:

﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا (٧٤)﴾ **الفرقان: ٧٤**

ئەی پەروەردگارمان ببەخشە پێمان لە هاوسەران و نەوەکانمان (منداڵەکانمان) ئەوەی چاوانی پێ گەش بێ هۆی دڵخۆشی بێت وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران و لەخواترسان.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا هَبْ لَنَا | ئەی پەروەردگارمان ببەخشە پێمان |
| مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا | لە هاوسەران و نەوەکانمان (منداڵەکانمان) |
| قُرَّةَ أَعْيُنٍ | ئەوەی چاوانی پێ گەش بێ هۆی دڵخۆشی بێت |
| وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا | وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران و لەخواترسان |

٢٩

## دوعای ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) وَاجْعَل لِّي لِسَانَ
صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ (٨٤) وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) وَاغْفِرْ
لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ (٨٦) وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ (٨٧)﴾

**الشعراء: ٨٣ - ٨٧**

ئەی پەروەردگارم دانایم پێ ببەخشە بمبەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە. وە باس کردنم بە چاکە لەناو گەلە داهاتووەکاندا پێ ببەخشە. وە بمگێڕی لەوەرگرانی بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت. وە لە باوکم خۆش ببە بەڕاستی ئەو لەگومڕایانە. وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا | ئەی پەروەردگارم دانایم پێ ببەخشە |
| وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ | بمبەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە |
| وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ | وەباسکردن بە چاکەم پێببەخشە |
| فِي الْآخِرِينَ | لەناو گەلە داهاتووەکاندا |
| مِن وَرَثَةِ | لەوەرگرانی |
| جَنَّةِ النَّعِيمِ | بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت |
| الضَّالِّينَ | گومڕایان |
| وَلَا تُخْزِنِي | وە شەرمەزار و ڕیسوام مەکە |
| يَوْمَ يُبْعَثُونَ | لە ڕۆژێکدا کە (خەڵکی) زیندوو دەکرێنەوە |

**٣٠**

## دوعای نووح پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ (١١٧) فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي
وَمَن مَّعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١١٨)﴾ **الشعراء: ١١٧ - ١١٨**

ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەکەم بڕوایان پێ نەکردم. کەواتە لە نێوان من و ئەواندا حوکم بدە بەحوکم دانێکی یەکجاری و من و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگار بکە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ | بێگومان گەلەکەم بڕوایان پێ نەکردم |
| فَافْتَحْ | کەواتە حوکم بدە |
| بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ | لە نێوان من و ئەواندا |
| فَتْحًا | بەحوکم دانێکی یەکجاری |
| وَنَجِّنِي | وە من ڕزگار بکە |
| وَمَنْ مَعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ | ئەوانەش لەگەڵمدان لەباوەڕداران |

٣١

## دوعای لووط پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ (١٦٩)﴾ الشعراء: ١٦٩

ئەی پەروەردگارم خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لە (تۆڵەی) ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| نَجِّنِي وَأَهْلِي | خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە |
| مِمَّا يَعْمَلُونَ | لە (تۆڵەی) ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن |

٣٢

## دوعای سولەیمان پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾

**النمل: ١٩**

ئەی پەروەردگارم وام ڕابێنە کە سوپاسی ئەو چاکە و نیعمەتەکانت بکەم کە ڕشتووتە بەسەر من و دایک و باوکمدا وە (ڕام بێنە) کە کارو کردەوەی چاکە بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانت.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| أَوْزِعْنِي | ڕام بێنه |
| أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ | كه سوپاسی چاكه و نیعمه‌ته‌كانت بكه‌م |
| الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ | كه ڕشتوته به‌سه‌ر من و دایک و باوكمدا |
| تَرْضَاهُ | كه تۆ پێی ڕازی بیت |
| وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ | وه به به‌زه‌یی خۆت بمخه‌ره |
| فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ | ڕیزی به‌نده چاكه كانت |

٣٣

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾

**القصص: ١٦**

وتی ئه‌ی په‌روه‌ردگارم به‌ڕاستی من سته‌مم له خۆم كرد ده‌ی لێم خۆشبه جا بێگومان ته‌نها ئه‌و لێبورده‌ی به به‌زه‌ییه.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي | بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کرد |
| فَاغْفِرْ لِي | دەی لێم خۆشبە |
| فَغَفَرَ لَهُ | ئەویش (خودا) لێی خۆش بوو |

۳٤

## دوعای مووسا پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٢١)﴾ **القصص: ٢١**

(مووسا) وتی ئەی پەروەردگارم ڕزگارم بکە لەم کۆمەڵە ستەمکارە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| نَجِّنِي | ڕزگارم بکە |

٣٥

## دوعای لووط پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ انصُرْنِي عَلَى الْقَوْمِ الْمُفْسِدِينَ (٣٠)﴾ العنكبوت: ٣٠

ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە (و زاڵم بکە) بەسەر ئەو گەلە خراپەکارەدا.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبِّ انصُرْنِي | ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە (و زاڵم بکە) |
| عَلَى الْقَوْمِ الْمُفْسِدِينَ | بەسەر ئەو گەلە خراپەکارەدا |

٣٦

## دوعای کافران:

﴿رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾

السجدة: ١٢

ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان و بیستمان دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیا) تا کردەوەی چاک بکەین بەڕاستی ئێمە دڵنیاین لە(بونی) قیامەت.. (دەبێ مسوڵمان خۆی بپارێزێ کردەوەکانی لە دنیادا وا نەبێت لە قیامەتدا پەشیمان بێت ئەو دوعایە بکات کە کافر و بێباوەڕان دەیکەن ).

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا | (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان و بیستمان |
| فَارْجِعْنَا | دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیا) |
| إِنَّا مُوقِنُونَ | بەڕاستی ئێمە دڵنیاین لە(بونی) قیامەت |

٣٧

## دوعای کافران (خەڵکی سەبەء):

﴿رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ
وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾

سبأ: ١٩

ئەی پەروەردگارمان ماوەی (ڕێگەی) سەفەرەکانمان دوور بخەرەوە و ستەمیان لەخۆیان کرد ئێمەش کردمانن بە داستانێ لەناو خەڵکدا بیگێڕنەوە پرژ و بڵاومان کردن (بە وڵاتاندا) بەوپەڕی پرژو بڵاو کردن بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا چەند نیشانە هەیە بۆ هەموو خۆگرێکی شوکرانە بژێر. (مسوڵمان نابێ ئەم دوعایە بکات چونکە هێنانی خراپەیە بۆیان).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا | ئەی پەروەردگارمان ماوەی (ڕێگەی) سەفەرەکانمان دوور بخەرەوە |
| فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ | ئێمەش کردمانن بە داستانێ لەناو خەڵکدا بیگێڕنەوە |
| وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ | پرژ و بڵاومان کردن (بە وڵاتاندا) بەوپەڕی پرژو بڵاو کردن |
| صَبَّارٍ شَكُورٍ | زۆر خۆگری شوکرانە بژێر |

## ٣٨

## دوعای دۆزەخیان:

﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ (٣٧)﴾

**فاطر: ٣٧**

ئەی پەروەردگارمان (لە دۆزەخ) دەرمان بێنە تا کردەوەی چاک بکەین جیاواز لەوەی دەمان کرد (وەڵام دەدرێنەوە) ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێ بیر بکاتەوە تیایدا بیر بکاتەوە وە ترسێنەرتان بۆ نەهات دەی (ئەو سزا) بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێک بۆ (بێ باوەڕە) ستەمکارەکان نییە. (مسوڵمان نابێ ئەم دوعایە بکات، چونکە دوعایەکی نابەجێیەو نایەتەدی).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا أَخْرِجْنَا | ئەی پەروەردگارمان (لە دۆزەخ) دەرمان بێنە |
| نَعْمَلْ صَالِحًا | تا کردەوەی چاک بکەین |
| غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ | جیاواز لەوەی دەمان کرد |
| أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم | ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن |

| | |
|---|---|
| مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ | ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێ بیر بکاتەوە تیایدا بیر بکاتەوە |
| فَذُوقُوا | دەی (ئەو سزا) بچەژن |
| نَّصِيرٍ | پشتیوان ویاریدەدەر |

٣٩

## دوعای ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ الصافات: ١٠٠

ئەی پەروەردگارم منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە.

٤٠

## دوعای کافران:

﴿وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ (١٦)﴾ ص: ١٦

وە وتیان: ئەی پەروەردگامان پێش ڕۆژی لێ پرسینەوە بەشەکەمان (لە سزا یا پاداشت) پێ بدە. (نابێ مسوڵمان ئەم دوعایە بکات چونکە داوای هاتنی سزا یا پاداشت دەکەن لە دنیادا پێش هاتنی قیامەت).

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| عَجِّل لَّنَا | پێشیخە بۆمان |
| قِطَّنَا | بەشەکەمان (لە سزا یا پاداشت) |
| قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ | پێش ڕۆژی لێ پرسینەوە |

٤١

## دوعای سولەیمان پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّن بَعْدِي إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ (٣٥)﴾ ص: ٣٥

ئەی پەروەرگارم لێمخۆشبە و دەسەڵات و پاشایەتیەکم پێ ببەخشە کە دوای من دەس نەدا بۆ کەسی تر بێگومان تەنها تۆی بەخشندەی هەموو شتێکی.

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| وَهَبْ لِي مُلْكًا | وە دەسەڵات و پاشایەتیەکم پێ ببەخشە |
| لَّا يَنبَغِي | دەس نەدا، شیاوی نەبێ |
| لِأَحَدٍ مِّن بَعْدِي | بۆ هیچ کەسێک لە پاش من |
| إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ | بێگومان تەنها تۆی بەخشندەی هەموو شتێکی |

٤٢

## دوعای ئەو فریشتانەی تەسبیحاتی خودا دەکەن:

﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا
سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ (٧) رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ
الَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ
الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٨) وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ
فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٩)﴾ غافر: ٧ - ٩

ئەی پەروەردگارمان میهرەبانی و زانیاریت هەموو شتێکی گرتوتەوە دەی خۆش ببە لەوانەی تۆبەیان کردووە و شوێنی ڕێگای تۆ کەوتوون وبیانپارێزە لە سزای دۆزەخ ئەی پەروەردگارمان بیشیان خەرە بەەشتانێکی هەمیشەیی کە بەڵێنت پێ دابوون هەروەها ئەو کەسانەش چاکەکار بوون لە باووباپیران و هاوسەران و ڕۆڵەکانیان (نەوەیان) بەڕاستی هەر تۆ زاڵی کاردروستی. وە بیانپارێزە لە( تۆڵەی) تاوانەکان چونکە هەر کەسێک لە (تۆڵەی) خراپە و تاوان بپارێزی لەو ڕۆژەدا ئەوە بێگومان ڕەحمت پێ کردووە وە هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ | هەموو شتێکی گرتۆتەوە |
| تَابُوا | تۆبەیان کردووە |
| وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ | وە شوێنی ڕێگای تۆ کەوتوون |
| وَقِهِمْ | وە بیانپارێزە |
| عَذَابَ الْجَحِيمِ | سزای دۆزەخ |
| جَنَّاتِ عَدْنٍ | بەهەشتانێکی هەمیشەیی |
| وَعَدتَّهُمْ | بەڵێنت پێ دابوون |
| صَلَحَ | چاکەکار بوون |
| الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ | زاڵی کاردروست |
| الْفَوْزُ الْعَظِيمُ | سەرکەوتنی گەورە |

٤٣

## دوعای کافران:

﴿رَبَّنَا أَرِنَا اللَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا
لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ (٢٩)﴾ فصلت: ٢٩

ئەی پەروەردگارمان ئەو دوانەمان نیشان بدەن کە گومڕایان کردین لە جنۆکە و ئادەمی تا بیانخەینە ژێر پێمان تا لە ژێری ژێرەوەی دۆزەخ بن.(نابێ مسوڵمان ئەم دوعایە بکات چونکە کافران لە ناو دۆزەخدا ئەم دوعایە دەکەن).

## ماناى وشەكان:

| | |
|---|---|
| رَبَّنَا أَرِنَا | ئەی پەروەردگارمان نیشان بدەن |
| أَضَلَّانَا | گومڕایان کردین |
| الْأَسْفَلِينَ | ژێری ژێرەوە(ی دۆزەخ) |

٤٤

## دوعای باوەڕداران لە ئوممەتی ئیسلام:

﴿سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ (١٣) وَإِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ (١٤)﴾ **الزخرف: ١٣ - ١٤**

پاک و بێگەردی بۆ ئەو (خوایە)ی کە ئەمەی بۆ ڕامهێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو. وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەرگارمان دەگەڕێینەوە.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| سُبْحَانَ الَّذِي | پاک و بێگەردی بۆ ئەو (خوایە)ی |
| سَخَّرَ لَنَا | کە ڕامیهێناوە بۆ ئێمە |
| وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ | ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو |
| لَمُنقَلِبُونَ | دەگەڕێینەوە |

٤٥

## دوعای کافران:

﴿رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ (١٢)﴾ الدخان: ١٢

ئەی پەروەردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە بەڕاستی ئێمە باوەڕدارین.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| اكْشِفْ عَنَّا | لەسەرمان لاببە |
| الْعَذَابَ | سزا |

٤٦

## دوعای باوەڕداری ڕاستەقینە:

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي ۖ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ (١٥)﴾ الأحقاف: ١٥

ئەی پەروەردگار ڕامبێنە تا شوکرانەبژێری ئەو بەهرە و چاکەیەت بکەم کە ڕشتوتە بەسەر من و دایک و باوکم دا وە (ڕامبێنە) کردەوەی چاک بکەم کە تۆ پێی ڕازی بی نەوەکانیشم چاک و صاڵح بکە بێگومان بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوە وە بەڕاستی من لە مسوڵمانانی گەردنکەچم.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا | وە (ڕامبێنە) کردەوەی چاک بکەم |
| تَرْضَاهُ | کە تۆ پێی ڕازی بی |
| وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي | وە منداڵ ونەوکانم صاڵح بکە |
| إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ | بێگومان بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوە |

٤٧

## دوعای نووح پێغەمبەر (علیه السلام):

﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا (٢٦) إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا (٢٧) رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا (٢٨)﴾ نوح: ٢٦ - ٢٨

ئەی پەروەردگار هیچ کەسێک لە بێ بڕوایان لەسەر زەوی مەهێڵە. چونکە بێگومان ئەگەر تۆ وازیان لێ بێنیت: بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن وە هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەکەر دەخەنەوە. ئەی پەروەردگارم خۆش ببە لە خۆم و باوکم و دایکم وە لەو کەسە کە دێتە ماڵم بە بڕواداریی یەوە وە لە هەموو پیاوان و ژنانی ئیماندار(خۆش ببە) وە بەشی ستەمکاران زیاد مەکە تیاچوون و لە ناوچوون نەبێ. (نابێ مسوڵمان ئەو دوعایە بکات کە ئایەتی (٢٦،٢٧)و کۆتایی ئایەتی (٢٨) دایە ئەو دوعایە تایبەتی ئەو پێغەمبەرەیە).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ | لەسەر زەویدا مەیهێڵە |
| مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا | هیچ کەسێک لە بێ بڕوایان |
| إِن تَذَرْهُمْ | ئەگەر تۆ وازیان لێ بێنیت |
| يُضِلُّوا عِبَادَكَ | بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن |
| وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا | هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەکەر دەخەنەوە |
| وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ | وە بەشی ستەمکاران زیاد مەکە |
| إِلَّا تَبَارًا | تیاچوون و لە ناوچوون نەبێ |

٤٨

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم:

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١) مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢) وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ
إِذَا وَقَبَ (٣) وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ (٤) وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ
إِذَا حَسَدَ (٥)﴾ الفلق: ١ - ٥

ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە دروست کەری بوونەوەر (پەروەردگاری بەرەبەیان) لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە. وە لە زیانی تاریکی کاتێک کە

دابێ. وە لە زیانی فووکەران(جادوو کەران) بە گرێ یاندا. وە لە زیانی بەخیل و حەسوود کاتێک کە حەسوودی ببات.

## فضل قراءة المعوذتين

عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:( ألم تر آيات أنزلت الليلة لم ير مثلهن قط؟ ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) رواه مسلم

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: ((ئایا دەزانی ئەم چەند ئایەتێکم دابەزێنراوە بۆم کە هەرگیر وێنەیان نەبینراوە؟ (ئایەتەکانی سورەتی) (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ).

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| قُلْ أَعُوذُ | بڵێ: پەنا دەگرم |
| بِرَبِّ الْفَلَقِ | بە پەروەردگاری بەرەبەیان، بە دروست کەری بوونەوەر |
| مِنْ شَرِّ | لە زیانی |
| مَا خَلَقَ | ئەوەی کە دروستی کردووە |
| غَاسِقٍ | تاریکی |

| | |
|---|---|
| إِذَا وَقَبَ | کاتێک کە دادێ تاریک دەبێ |
| النَّفَّاثَاتِ | فووکەران(جادوو کەران) |
| فِي الْعُقَدِ | بە گرێ یاندا |
| حَاسِدٍ | بەخیل و حەسوود |
| إِذَا حَسَدَ | کاتێک کە حەسوودی ببات |

٤٩

## دوعای موحەممەد پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم:

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ (١) مَلِكِ النَّاسِ (٢) إِلَٰهِ النَّاسِ (٣)
مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤) الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ
(٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ (٦)﴾ الناس: ١ - ٦

ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی. پادشای خەڵکی. پەرستراوی خەڵکی. لە زیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهانکەر. ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دڵی خەڵکی. لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد.

## مانای وشەکان:

| | |
|---|---|
| بِرَبِّ النَّاسِ | پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی |
| مَلِكِ النَّاسِ | پادشای خەڵکی |
| إِلَٰهِ النَّاسِ | پەرستراوی خەڵکی |
| الْوَسْوَاسِ | وەسوەسە پەیداکەر |
| الْخَنَّاسِ | خۆ پەنهانکەر |
| يُوَسْوِسُ | وەسوەسە ئەخاتە |
| فِي صُدُورِ النَّاسِ | ناو دڵی خەڵکی |
| مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ | لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد |

# یاساکانی (نونی) زەنە دار و تەنوین

١-(التنوين، ـًـٌـٍ) ئەو نونە زەنەدارەیە کە بەکۆتایی ناوەوە نووساوە لە وتن و گەیاندندا، بەڵام لە نوسین و وەستان لە سەر وشەکە لێی جیا دەبێتەوە.

نیشانەی تەنوین: دوو فەتحە وەک:( علیماً) دوو بزوێن وەک: (علیمٌ) دوو ژێر وەک: (علیمٍ)

پیتی(نْ) ی زەنەدار: دەکرێت لە ناودا هەبێت، وەک: (الأنْعام).

وە دەشکرێت لە پیتدا هەبێت، وەک: (إنْ، عنْ ) هەروەها لە کرداردا (الفعل ) وەک: (يَنْحِتُون ) وە لە ناوەڕاست و کۆتایی ووشەشدا دێت، بەڵام هەرگیز لە سەرەتای وشەوە نایەت.

هەرکات نونی زەننە دار، یان تەنوین پێش پیتەکانی زمانی عەرەبی بکەوێت، چوار حوکمیان

بۆ دروست دەبێت کە ئەمانەن:

١- الإدغام. ٢ - الأظهار. ٣- القلب. ٤- الاخفاء.

١- الإدغام، لە زمانەوانیدا: تێهەڵکێشان.

لە زاراوەدا: بریتییە لە گەشتنی پیتێکی زەنەدار بە پیتێکی جوڵاو (مُتَحَرِكٌ) بەشێوەیەک وەک یەک پیتی شەدەداری لێدێت لەجۆری پیتی دووەم، وە لەسەر هەردوو پیتەکەوە یەکجار دەرچەکە بەکاردێت.

پیتەکانی (الإِدغام) شەش پیتن و لە وشەی: (یرملون)دا کۆکراونەتەوە.

## تێهەڵکێش کردن دوو بەشە:

١- تێهەڵکێشانی بە مینگە: (ناتەواو) ئەم تێهەڵکێشانە کاتێک ڕوو دەدات لە پاش نونی زەنەدار، یان تەنوین، یەکێک لەم چوار پیتە بێت: (ی، و، م، ن) کۆکراوەتەو لە ووشەی (یومن) یان (ینمو)

نمونە: (منْ يعمل- خيراً يَرَ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (ميَّعمل) (خيرَيَّرَ).

(منْ وَلِيٍّ - شيءٍ وكيل ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە (مِوّلي) (شيئِوَّكيل)

(منْ مال - خيرٌ من) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (مِمّال) (خيرُمِّن)

(لَنْ نُشْرِكَ - يَومَئِذٍ ناعمة ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (لَنُّشرِكَ ) (يَومَئذِ نَّاعمة)

٢- تێهەڵکێشانی بێ مینگە )تەواو(، کاتێک لە دوای نونی زەنەدار، یان تەنوینەوە پیتی (ل) یان (را) هات، ڕوودەدات.

نمونە( مِنْ لَّدُنْهُ = مِلَّدُنْهُ)، (هُديً لِّلمُتَقِينَ= هدَ لِّلمُتَقينَ)، (مِنْ رَّبهم = مِرَّبهم،) (غفورٌ رَّحيم = غفورُ رَّحيم ).

## سود:

أ- ئەگەر لەپاش (نونی زەنەدارەوە ) پیتی(و)، (ی) هات، لە یەک وشەدا ئەوا ( إدغام )تێهەڵکێشان ڕوونادات، پێویستە (إظهار) بکرێت وەک: (قنوان)(صنوان)، (الدنيا)،( بنيان)

ب- لە ریوایەی ( حفص عن عاصم)دا لە ڕێگای ( الشاطبي)یەوە لەکاتی گەیاندنی:

(ن والقلم) و (يس والقرآن) (إدغام) تێهەڵکێش ڕوونادات لەنێوان ( نون) و (واو) (ن والقلم) یان (يس والقرآن).

ج- تێهەڵکێشی منگەدار، پێی دەوترێت ناتەواو( ناقص)، چونکە سفەتی مینگە لە پیتی (ن)

دەمێنێتەوە بە تەواوەیتی (إدغام) ناکرێت.

تێهەڵکێشی تەواو (کامل) پیتی یەکەم بەتەواوەتی چوەتە ناو پیتی دووەم و هیچ سیفەتێکی لێنەماوە.

د- نیشانەی تێهەڵکێشی ناتەواو( الإدغام الناقص) لە نووسینی ئایەتە پیرۆزەکاندا ئەوەیە کە لەپاش (ن) و (تەنوین) (علام)ە و نیشانەی شەددە (ـّ) لە سەر هەردوو پیتی: (و، ی) نانوسرێت. بۆ نموونە: (منْ وّلي)، ( فمنْ يّعمل).

٢- (الإظهار ) لە زمانەوانیدا: ئاشکراکردن.

لەزاراوەدا: دەرخستنی پیتی (ن) بە تەواوەتی لە دەرچەکەیەوە بەبێ زیادکردنی سیفەتی مینگە.

(إظهار) ئاشکراکردن: کاتێک ڕوو دەدات کە لە دوای نونی زەنەدار و تەنوینەوە یەکێک لەم شەش پیتانەی گەروو بێن: (و، ه، ع، ح، غ، خ) جا لە یەک وشەدا بوون یان دوو وشەدا، ئەوکاتە نونە زەنەدارەکە، یان تەنوینەکە ئاشکرا دەکرێت بە تەواوی و بەبێ هیچ دەستکارییەک لە سیفەتەکانیدا.

## سیفەتەکانی:

پیتەکانی(إظهار) لەسەرتای ئەم وشانەوە (أَخِي هاكَ عِلماً حازهُ غَيرُ خاسِرٍ)

نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| الهمزة | مَنْ آمَنَ | عَذَاباً أليماً | يَنْئَونَ |
| الهاء | مِنْ هَادٍ | قومٍ هَادٍ | يَنهَى |
| العين | مَّنْ عَمِلَ | سميعٌ عَليمٌ | أنْعَمتَ |
| الحاء | مِنْ حَكيمٍ | عليمٌ حكيمٌ | يَنْحِتُونَ |
| الغين | مِنْ غَيرٍ | ماءً غَدَقاً | فَسَيُنغِضُونَ |
| الخاء | مِنْ خَيرٍ | كَرَةٌ خَاسِرَةٌ | وَالمنْخَنِقَةُ |

## سوود:

أ- نیشانەی ئاشکراکردنی(نونی ساکن) لە نوسینی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دانانی ئەم

نیشانەی (ـــْـ) لەسەر پیتی (نْ) (مَنْ ءامَنَ)

ب- نیشانەی ئاشکراکردنی تەنوین دانانی دوو (ضمة) یە لەسەر یەک بەم شێوەیە (ـٌـ) و خستنە سەر یەکی دوو (فتحة) بەم

شێوەیە(ـــً ) خستنە سەر یەکی دوو (کسرة) بەم شێوەیە (ـــٍ) علمٌ حكيم- عَذاباً أليماً.

٣- (القلب) لە زمانەوانیدا: واتە هەڵگەڕانەوە.

لە زاراوەدا: گۆڕینی نونی سکوندار یان تەنوین بە(میم)ی شاراوەی مینگەدار کاتێ دەگەن بە پیتی (باء). نیشانەی (القلب) دانانی میمێکی بچوکە لەسەر (نونی سکوندار) بەم شێوەیە

(ن م). وەک ( مِنْ بَعدِ = ممبعد) (أنْبِئهُم = أَمبِئهم) (سميعٌ بَصيرٌ = سَمِيعمبصير)

٤- (الإخفاء) لە زمانەوانیدا: شاردنەوە.

لەزاراوەدا: وتنی نونی سکوندار، یان تەنوینە بە شێوازێک لە نێوان دەرخستن (إظهار) و تێهەڵکێش (إدغام) کردندا بەبێ شەددە، لەگەڵ مانەوەی مینگە لە پیتی یەکەمدا.

پیتەکانی (الإخفاء) لە سەرەتای پیتەکانی ئەم دێرە هۆنراوەوە هاتووە:

صِفْ ذا ثَنَا كَمْ جَادَ شَخْصٌ قَدْ سَمَا
دُمْ طَيِّبًا زِدْ فِي تُقًي ضَعْ ظَالِمًا

تێبینی: نیشانەی هەڵگەڕانەوە لە تەنویندا نوسینی میمێکی بچوکە لە جێی چوڵەی دووەمی تەنوینەکە بەم شێوەیە (وم) (سميعٌ بَصيرٌ، جزاءَ بِما، شيءٍ بَصيرٌ)

| | | |
|---|---|---|
| الصاد | مَنْصوراً | بِرِيحٍ صَرْصَرٍ |
| الذال | تُنْذِرهُم | عَزِيزٌ ذوانتقام |
| الثاء | الأُنثَى | ماءً ثَجاجاً |
| الكاف | مِنْكُم | كِرَاماً كاتِبِينَ |
| الجيم | أَنْ جَاءَهُ | عَيْنٌ جَارِيةٌ |
| الشين | مِنْ شَيءٍ | قَوِيٌّ شَدِيدُ |
| السين | الإِنْسانُ | خَمسَةٌ سادِسُهُم |
| الدال | مِنْ دُونِ | وَكَأْساً دِهَاقاً |
| الطاء | عَنْ طَبَقٍ | كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ |
| الزاي | المُنْزِلُونَ | نَفساً زَكِيَّةً |
| الفاء | أَنْفُسَكُم | تَبَعاً فَهَل |
| التاء | مِنْ تَفوت | حِليَةً تَلبِسُونَهَا |
| الضاد | مَنْضُودٍ | قِسمَةٌ ضِيزَى |
| الظاد | يَنْظُرُون | مَثَلاً ظَلَّ وَجهُهُ |

## تێبینی:

١. پێویستە زمانت بۆ پیتی دوای نونە ساکنەکە، یان تەنوینەکە ئامادە بکەیت و نزیکی بکەیتەوە لەدەرچەی پیتی دوای نونەکە، یان تەنوینەکە و نابێت بگات پێی، لەکاتی مینگەکە لەگەڵ تەواو بوونی مینگەکە یەکسەر زمانت دەدەیت لە مەخرەجی پیتی پاش نونەکە.

٢. هاوکات لە گەڵ مینگەکەدا دەنگێکی کەم لە دەمەوە دەردەچێت بەهۆی دانەخرانی مەخرەجی پیتەکان، جگە لە پیتی (ق، ک) کە بە تەواوەتی دادەخرێن.

٣. دەنگی نون یان تەنوین لە کاتی(إخفاء)دا قەڵەو دەبێت ئەگەر پیتێکی قەڵەوی بە دوادا بێت، وەک (مِنْ قبل، منصورا).




# ڕێنماییەکانی بەشداریی لە تاقیکردنەوەی پێشبڕکێی

# دوعاکانی قورئان

- لەبەرکردنی هەموو ئایەتەکان.
- لەبەرکردنی مانای وشەکان بە کوردی.
- زانین و لەبەرکردنی تەفسیر و ڕاڤەی ئایەتەکان.
- زانینی یاساکانی نونی ساکینە و تەنوین لەگەڵ نموونەکاندا کە لەم نامیلکەیەدا باسکراون، پێویستن لە تاقیکردنەوەدا.
- هەموو بابەتەکانی نامیلکەی (دوعاکانی قورئان)، زانین و لەبەرکردنیان تاقیکردنەوەی تێدا دەکرێت.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٨٥٣)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە